فەرهەنگی بانگخوازان

بەرگی شەشەم

# بەخۆداچوونەوەیەك لە
# خۆشەویستیی پێغەمبەر
# صلى الله عليه وسلم

ئەندازیار عوسمان

چاپی سێیەم

١٤٣١ ك

٢٠١٠ ز




# بەخۆدا چونەوەیەك لەخۆشەویستی پێغەمبەردا

## صلی الله علیه وسلم

**خوێنەری بەرێز...**

**لـەدوای خوێندنـەوەی ئـەم نامیلکەیـە بیـدە بەموسـڵمانێکی تـر، تـاکو زۆرترین موسڵمان لێی سودمەندبن.**




بسم الله الرحمن الرحيم


- ناوی کتێب: بەخۆداچوونەوەیەك لەخۆشەویستی پێغەمبەردا ﷺ
- نووسەر: ئەندازیار عوسمان .
- چاپ: سێیەم .
- ساڵی چاپ: ٢٠١٠ زاینی.
- چاپخانە : سیڤا ـ سلێمانی ـ شەقامی مەولەوی .
- ژمارەی سپاردن: (٢٣٤) ساڵی ١٩٩٩ زاینی پێدراوە .

# پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگاری جیهان و دروودو سلاویش لەسەر گیانی سەرداری پێغەمبەران و یارو یاوەرو هاوەڵان.

ئایینی ئیسلام زۆر گرنگی دەدات بە خۆشەویستی خواو پێغەمبەر(ﷺ)، بەجۆرێك کەلەنەفسی خۆمان خۆشترمان بوێن و هەردەم گیان فیدایان بین...

کەسەیری ژیاننامەی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەرﷺو هاوەڵانی بەڕێزیش دەکەین، بەئاشکرا هەست بەو سۆزو خۆشەویستی‌یە بێ سنوورە دەکەین کە دینەمۆی هەوڵ و تێکۆشانیان بووە لەژیانی پڕ خەبات و رەنجیانداو، زۆرێك لەو تابلۆ جوانانەی ژیانیان بڕواداری دل زیندوو خۆی بۆ ناگیرێ لەبەردەمیانا فرمێسك نەڕێژێ..

ئەمڕۆش کە گڕوتینی خۆشەویستی کزبووەو ماددیەت عالەمی سەرقاڵ کردووە، موسڵمانان بەگشتی‌و بانگخوازان بەتایبەتی زۆر پێویستە هەڵوێستەیان ببێت لەبەردەم ئەم مەسەلە گرنگەداو چاوێ بەدڵیانا بخشێننەوە و بەپێوەری قورئان و سوننەت خۆشەویستی یەکەیان پێوانە بکەن.

باسی خۆشەویستی خواو پێغەمبەر ﷺ کارێکی ئاسان نیە، کەسانی شارەزاو پسپۆرو دڵ ئاوەدانی دەوێت، کە نەك هەر قسە ریز بکات بەڵکو بەواقیعی خۆی تیایا بژی.

کە بەوەش زیاتر باسەکە لە دڵی بەرامبەردا جێی خۆی دەکاتەوەو لەژیاندا رەنگ ئەداتەوە.

خواناسێکی عاریفی وەك مەحوی شاعیر (١٢٤) دێڕ هۆنراوەی بەپێزی لەسەر حەزرەتی محمد ﷺ داناوەو ئەو هەموو وردەکاری‌یە جوانەی تیا کردووە، ئینجا دەڵێ:

چ مەدحێکت بکەم لائیق بەتۆ (یا خیر خلق الله)

منی بێ خێری نالائیق کە جیبرلیت پەنا خوانە...

ئەبێ من چی بڵێم.. کەبەم هەوڵە زۆر زۆر (متواضع)ەوە ئەمەوێ تیشکێ بخەمە سەر ئەوباسە.. بەهەر حاڵ لە پێشدا داوای لێ بووردن و مەعزەرەت لەحزووری پێغەمبەری خوا ﷺ ئەکەم، ئینجا لەخوێنەری بەرێزیش لەهەر کەمو کورتییەك کە لەباسەکەدا بێت...خوای گەورە خۆشەویستی خۆت و پێغەمبەرەکەت و موسڵمانان و هەموو کارێکی چاك ببەخشە پێمان و لەگەڵ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) و پیاوچاکان و شەهیداندا حەشرمان بکە ... امین

## خۆشەویستی خواو پێغەمبەر ( ﷺ )

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾﴾ البقرة: ١٦٦ - ١٦٧ واتە: هەردوومی وا هەیە کە هاوبەشی زۆر بۆ خوا پەیدا دەکات و خۆشی ئەوێن وەك خۆشەویستی خوا، ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بەخوا، خوایان لەهەموو شتێك خۆشتر دەوێت. ئینجا خوای گەورە هەڕەشەیان لێدەکات و دەفەرموێت: ئەوانەی ستەمیان کردوە لەخۆیان بەهاوبەش پەیداکردن بۆ خوا، ئەگەر ببینن لەو کاتەی کە لەبەردەمی خوادا رادەگیرێن، وەلەو دەمەی کە سزای خوا بەدی دەکەن! ئەگەر ئەمانە ببینن دەزانن، کە هەرچی هێزو دەسەلآت هەیە هەمووی هەر بۆ خوایە، وەکەس هیچی بەدەست نییە تەنیا ئەو نەبێ، وەسزای خۆی تیا نییە دووبارە ئەگەر ببینن ئەوستەمکارانە کاتێك پێشەواکانیان یەخە هەڵئەتەکێنن لەوانەی کەلەجیهانا دوایان کەوتوون وەپێیان دەڵێن: ئەمڕۆ

ئێمە هیچمان بەدەست نییە وەناتوانین یارمەتیتان بدەین، وەهــەر بــەڵێنێکمان پێــداون لەجیهانــدا درۆمــان کــرد، وەچــاویان بەســزای ئــاخرەت کــەوت وەپــچڕا ئــەو پەیوەندییانەی کە لەجیهانا بەستبونی بەیەکەوەو مایەی بەهرەمەنــدییان بــوو لەیــەکتری.. ئینجــا لــەم حەلــەدا خواردەســـتەکان، ئــاوات دەخـــوازن کـــە خۆیـــان و سەرۆکەکانیان بگەڕانایەتــەوە بــۆ جیهــان، تــا ئــەمانیش یەخــەی خۆیــان هــەڵ بتەکانایــە لەگــەورەکانیان وەدەڵــێن خۆزگــە ئێمــە بگەڕاینایەتــەوە بــۆ جیهــان تــا یەخــەمان هەڵبتەکاندایە هەروەك ئەوان جا هــەروەك ئەم سزای ڕۆژی دواییەیان نیشان دەدات، کردەوەکانیشیان نیشان دەدات، تــابیێ بەمایــەی داخ و خەفــەتیان. وە ئــەوان دەرچــوونیان نییە لە دۆزەخ.

قورئــانی پــیرۆز بــەم شــێوەیە دەیــەوێت تێیــان بگەیــەنێ کەخۆشەویــستی خــوا لەســەر و هــەموو خۆشەویــستیەکی ترەوەیە وە ئەوەی کەوا ناکات ئەوە سەرنجام و چارەنوسیەتی و هەرچی بکا بەهاوبەشی خوا فریای ناکەوێ.

خوای گەورە نیعمەتی زۆری بێ شوماری پێ بەخشیوین، بۆیە دەبێ بەوەفابینو خوامان لەهەموو شتێك لا خۆشەویستتر بێت وە پێغەمبەری خواشمان ﷺ لەبەر ئەو خۆش بوێ..

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (احبوا الله لما یغذوکم من نعمه، واحبوني بحب الله) حدیث حسن غریب ترمزی گێڕاویەتەوە، واتە: خواتان خۆش بوێ لەبەر ئەو هەموو نیعمەتەی کەپێی بەخشیون ومنیشتان خۆش بوێ لەبەر ئەوەی کە خوا خۆشی دەوێم...

بەڵێ ئەگەر خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لەسەروو هەموو خۆشەویستییەکەوە بوو ئەو کاتە ئەو بڕوادارە تامی خۆشی ئیمان دەچێژێ، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ﴿ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الايمان ان يكون الله ورسوله احب اليه مما سواهما وان يحب المرء لايحبه الا لله وان يكره ان يعود في الكفر بعد ان ان قذوه الله منه كما يكره ان يقذف في النار﴾ بخاری ومسلم.

واتە: (هەرکەسێ ئەم سێ شتەی تیابێت شیرینی باوەڕ دەچێژێ یەکەم: خوا و پێغەمبەری لەهەموو شتێك لاخۆشەویستربێ دووەم: هەرکەسێکی خۆش ویست لەبەرخوابێ سێهەم: چۆن حەز ناکا بیخەنە ئاگرەوە ئاواش حەز نەکات کە بگەڕێتە سەر بێ باوەڕی).

زۆرجار بڕوا دار وشك دەبێتەوە نەخۆش دەكەوێ و تامی دەمی تاڵ دبێت و هەست بەشیرنی ئیمان ناكات بۆیە چاك وایە زوو زوو بەخۆیدا بچێتەوەو ئیمان و باوەڕەكەی بەپێی تەرازووی قورئان و سونەت هەڵسەنگێنێ پێش ئەوەی كار لەكار بترازێ و شۆڕ بكرێتەوە بۆ ناو گۆڕو گەشتی قیامەتی دەست پێ بكات.

پێغەمبەر ﷺ فێری دوعایەكمان دەكات دەفەرموێت: (اللهم اني اسالك حبك وحب من يحبك والعمل الذي يبلغني حبك اللهم اجعل حبك احب الي من نفسي وأهلي ومن الماء البارد)ترمذی گێڕاویەتەوە. (صحيح)ە.

واتە/ پەروەردگارا خۆشەویستی خۆتم بەیتێ، وەخۆشەویستی ئەوانەش كە تۆیان خۆش دەوێ، وەخۆشەویستی ئەو كارەش كەدەمگەیەنێتە خۆشەویستیەكەت، پەروەدگارا خۆشەویستیەكەت وا لێ بكە لەدڵما، تاوەكو خۆشەویست تر بیت لەلام لەنەفسم وكەس و كارو ماڵ و مناڵم و ئاوی ساردی سەر تینوویتی..

یان دەفەرموێت (اللهم ارزقني حبك، وحب من ينفعني حبه عندك) ترمذی. واتە/ پەروەردگارا خۆشەویستی خۆتم پێ ببەخشی، وەخۆشەویستی كەسێكیش كە خۆشویستنەكەی سوودی هەبێ بۆم لەلای تۆ (سەیری مدارج السالكين /منزلەالمحبە) بكە.

## خۆشەویستی هاوەڵان:

یەکەم: کاتێك خەڵکی مەککە (زید کوری الدثنة)یان بەدیل گرتبوو، وەبردیان لەگەردنی بدەن، ئەبو سوفیان کە هێشتا بێ باوەڕ بوو لێی پرسی: حەز دەکەیت ئێستا محمد لەجێی تۆ لەگەردنی بدرایە و تۆش لەناو ماڵ و منداڵی خۆتدا بویتایە؟ زەید وتی: بەخوا حەز ناکەم محمد لەجێگای خۆیدا دڕکێکی پیا بچێ و منیش لەناو ماڵ و منداڵم دابم.. ئەبو سوفیان وتی: لەناو خەڵکا کەسێکم نەدیووە یەکێکی خۆش بوێ بەهێندەی ئەوەی کە هاوەڵنی محمد، محمدیان خۆش دەوێ...

دووەم: ئافرەتێکی ئەنصاری لەغەزایەکدا، باوك و براو مێردەکە شەهید دەبن، کە هەواڵی شەهید بوونیانی پێ دەگات، دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە؟... دەڵێن: لەسایەی خواوە سەلامەتە.. دەڵێت: هەموو بەلاّ و موسیبەتێك بەبوونی تۆو بەمانی تۆ چەند گەورەش بێت بچووکە و هیچ نیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

سێ یەم: لەسەرەمەرگدا بیلال خوا لێی رازی بێت لەهۆش خۆی چوو، ژنەکەی لەژوور سەری بوو وەیزانی مرد، هاواری کردو وتی: ئای لەم موسیبەتە گەورەیە... بیلال

هاتەوە هۆش خۆی‌و وتی: وامەڵێ من بەریم لەو قسەیە، بەڵکو بڵێ: ئای لەم خۆشی‌یە سبەینێ دەگەمەوە بە خۆشەویستان محمدﷺو هاوەڵانی...

<u>چوارەم</u>: عومەری کوڕی خطاب خوای لێ ڕازی بێ:

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی (والذي نفسي بيده لايؤمن أحدكم حتى أكون أحب اليه من نفسه وماله ولده والناس أجمعين) واتە: بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە هیچ یەکێ لە ئێوە بڕوای تەواوی نیە تاوەکو خۆشەویست تر نەبم لەلای لەخۆی و ماڵ و منداڵ و هەموو خەڵکی..عومەری کوڕی خطاب کەگوێی لەمە بوو فەرمووی: (بەخوا تۆ لەهەموو کەس لام خۆشەویستری تەنها لەخۆم نەبێت) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: نەخێر ئەی عومەر دەبێت لەخۆتیش خۆشترت بوێم..ئەویش فەرمووی: بەخوا ئێستا لەخۆمو لە هەموو کەس لام خۆشەویستری.. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئێستا ئیمان و بڕواکەت تەواوە ئەی عومەر.

ئەو خۆشەویستییە هە روا قسەیەکی رووت نییە بەدەم بوترێ، بەڵکو پلەو پایەیەکی بەرزە دڵ نایگاتێ مەگەر بەلوتف و و یارمەتی خوا، چونکە ئادەمی وا دروست کراوە تادوا پلە خۆی خۆش بوێتو هەرچیەکیش بەسترابێ بەخۆی و ژیانیەوە،

بەئاسانی ئەو خۆشەویستییە ژێر پێ ناخرێ لە پێناوی خۆشەویستییەکی تردا! زۆر کەس وا دەزانێ جڵەوی نەفسی خۆی گرتووەو لەخۆشەویستی و فیداکاری دا هیچی نەهێشتۆتەوە کەچی بەداخەوە هەر خەیاڵاتەو هێشتا وا لەئەلف و بێ ی مەسەلەکەدایەو رەنجی زۆرو هەوڵی پەی دەرپەی دەوێت بۆ ئەوەی بیگاتێ.

عومەری کوڕی خطاب رۆژێك بەدەم داخو خەفەتی زۆری کۆچی یەکجاری حەزرەتی محمد ﷺ دەڵێت: ئەی خۆشەویستی خوا دایك و باوکم بەقوربانت بن هەقمانە لە دووریت بناڵین، مەگەر لقە دارخورماکەی خوتبەت لەتەنیشتەوە دەدا نەینالند کاتێ بەجێت هێشت و چویتە سەر (مینبەرەکەت)، وە لەناڵین نەکەوت تا دەستی موبارەکت هێنا بەسەری دا..

ئەی خۆشەویستی خواﷺ تۆ دوا پێغەمبەری و خوا لەپێش هەمواندا باست دەکات، مەگەر نافەرموێت: ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ۝٧﴾الأحزاب: ٧

واتە: باسی ئەو کاتە بکە کە ئێمە پەیمانمان وەرگرت لە پێغەمبەران، وە لە تۆو لەنوح و ئیبراهیم و موساو عیسای کوڕی

مەریەم، وەلێمان وەرگرتن پەیمانێکی گەورەی بەتین، کە بەچاکی پەیامی خوا بگەیەنن و شەوو رۆژی بۆ بدەنە دەمیەك.
ئەی خۆشەویستی خوا ﷺ موسا کەداری دەستی‌دا بە بەردا ئاوی‌لێ دەرهات، کەچی تۆ لەنێوان پەنجەکانتەوە ئاو هەڵقولاو سوپایەك ئاوی خواردەوە، ئەی خۆشەویستی خوا، حەرزەتی عیسا بەفەرمانی خوا مردووی زیندوو دەکردەوەکەچی تۆ نەك هەر مردوو بەڵکو بەفەرمانی خوا پارچە گۆشتێکی کوڵاو هەواڵی دایتێ کە مەم خۆ زەهرم پێوە کراوە...
ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر عادەت بوایە، کەس لەگەڵ هاو کوفئی خۆیدا نەبێ دانەنیشێ، ئەوا هەق نەبوو تۆ یەکی پایە بەرز لەگەڵ ئیمەدا دانیشی...
<u>پێنجەم</u>: (طەلحەی کوری بەڕاء) خوا لێی رازی بێت:
طەلحەی کوری بەڕاء لاوێکی تەمەن ١٣ساڵ بوو، لەگەڵ دایك و باوکی‌و هۆزەکەیدا دەژیا لە (قوباء) لەنزیك شاری مەدینە، خۆشترین رۆژی ئەو رۆژە بوو کە پێغەمبەری خوای ﷺ بینی بۆیەکەم جار لە (قوباء) کە تازە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کردبوو بۆی.

لەم رۆژەدا طەلحە خۆشەویستی پێغەمبەرﷺچووە دڵیەوە، حەزی دەکرد دەم و دەست موسڵمان ببێ، بەڵام لەلایەکی ترەوە نەیدەویست قسەی دایك و باوکی بشکێنێ کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوون...

کێشەیەکی دەروونی بۆ دروست بوو، ماوەیەك پێوەی دەتلایەوە، تا سەرەنجام خۆی یەکلایی کردەوە چوو بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ و وتی: ئەمەوێ بەیعەتت لەگەڵدا بکەم، پێغەمبەریش ﷺ پرسیاری دایك و باوکی لێ کرد، ئەویش وتی: تا ئێستا بێ باوەڕن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشە بەیعەت دەدەی بەگوێ رایەڵی ئەگەر فەرمانیشت پێ بدەم بە وازهێنان و بەگوێ نەکردنی دایك و باوکیشت؟ ئا لێرەدا تاقی کردنەوەکە قورس بوو لای، چونکە دایك و باوکی زۆر خۆش دەویست، وتی: ناتوانم کاری وا بکەم و پێغەمبەریش ﷺ وازی لێ هێنا...

پاش ماوەیەکی دیکە (تەڵحە) هاتەوە گوتی: دەستت بێنە با بەیعەتت لەگەڵدا بکەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر فەرمانیشت پێ بدەم دەست لەدایك و باوکت هەڵگری هەر پەیمان دەدەی (طەلحە) جارێکی تر تاقی کردنەوەکەی لا قورسو گران بوو وەخۆشەویستی دایك و باوکی زاڵ بوونەوە بەسەریاو نەیتوانی بەیعەت بدات..

پاش ماوەیەکی دیکە (طەلحە) لەمزگەوتدا بەیعەتی‌دا بە پێغەمبەرﷺ لەسەر گوێڕایەڵی تەواو بۆ هەموو فەرمانێك ئەگەر بەگوێ‌ی‌نەکردنی دایك و باوکیشی تێدا بێت..

پاش تەواو بوونی بەیعەت دانەکە، پێغەمبەر ﷺ هۆی تاقی کردنەوەکەی بۆ روون کردەوەو فەرمووی:

ئەی طەلحە لە ئاینی ئێمەدا دەست لەدایك و باوك هەڵناگیرێ و (قطعی صیلە ی رەحم) ناکرێت، بەڵام حەزم کرد تاقیت بکەمەوەو ئاینەکەت و بڕواکەت گومانی تیا نەبێت.

طەلحە بەم فەرمایشتەی حەزرەت ﷺ زۆ دڵخۆش بوو، رۆژانە سەری ئەدا لە پێغەمبەر ﷺ، تا وای لێ هات خواو پێغەمبەری لەهەموو کەسێ لا خۆشەویستر بوو..

ڕۆژێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بەگەرمی باوەشی پیا کردو دەستی پیرۆزی ماچ کرد وتی: بەچی فەرمانم پێ دەدەی بەگوێت دەکەم و هەرگیز لەفەرمانت دەرناچم..

پێغەمبەر ﷺ ویستی ئەم جارەش تاقی بکاتەوە فەرمووی: دەباشە بڕۆ باوکت بکوژە...

طەلحە قسەکەی لێ دووبارە نەکردەوەو یەکسەر هەستا بچێ فەرمانەکەی جێ بەجێ‌بکا.. پێغەمبەریش ﷺ زۆر دڵشاد

بوو بە ئیمان و باوەڕی دامەزراوی، بۆیە خێرا موسڵمانێکی نارد بەدوایاو لە دەرەوەی مزگەوت بانگیان کردەوە...

کە گەڕایەوە پێغەمبەر ﷺ پێکەنی و دەستی خستە سەر هەردوو شانی بەنەرمی ڕایوەشاندو فەرمووی: پێم نەوتی‌من فەرمان بەپچڕانی پەوەندی ڕەحمو خزمایەتی نادەم.

پاش ماوەیەك دایك و باوکی (طەلحە)ش موسڵمان بوون و هەموو ڕۆژ لە (قوباء)ەوە دەهاتن بۆ مەدینە بۆ زیارەتی خۆشەویستی خوا محمد ﷺ.

پاش چەند مانگێك (طەلحە) نەخۆشییەکی قورسی گرت و لە جێگەدا کەوت، ڕۆژێکی ساردو سەرما بوو، حەزرەت ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی‌دا هاتنە سەردانی، بەڵام چونکە (طەلحە) بێ هۆش کەوتبوو نەیتوانی بەدیداری پڕ نووری شاد بێت، پێغەمبەریش ﷺ کە حاڵەکەی بینی زۆر دڵی پێ سوتاو پاش ئەوەی دوعای‌خێری بۆکردو بەکەس و کارەکەی فەرموو: وا ئەبینم طەلحە زوو گیان بسپێرێ، ئەگەر وەفاتی کرد هەواڵم بدەنێ، تا نوێژی لەسەر بکەم و ئامادەی ناشتنەکەی ببم.

پاش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە بۆ مەدینە، لەنیوە شەودا طەلحە هاتەوە هۆش خۆی‌و چاوەکانی هەڵهێناو و بەکەس و کارەکەی وت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەری نەدا، وتیان بەڵێ

سەری داو دوعای خێری بۆ کردیت و فەرمووی: زوو هەواڵی طەلحەم بدەنێ..

طەلحە زۆر دڵخۆش بوو بەهاتنی سەرداری پێغەمبەران ﷺ، ئینجا بەدایك و باوکی وت: ئەوەندەم نەماوە دەمرم، ئەگەر مردم زوو بمنێژن، با زوو بگەڕێمەوە لای پەروەردگارم، لەم شەوەشدا هەواڵ نەدەن بە پێغەمبەر ﷺ نەوەکو زەحمەت بکێشێ و بێت و مارو مێروو پێوەی بدەن، یان تووشی شتێك ببێت، من دەترسم بەهۆی منەوە جوولەکە زیانێکی پێ بگەیەنێت..

وەئەگەر مردم سەلامی منی پێ بگەیەنن، پێی بڵێن: باداوای لێ خۆش بوونم بۆ بکات.. پاش سەعاتێك لاوی خواناس گیانی پاکی سپارد، لەسەر وەسیەتەکەی خۆی هەر زوو بەچاوی پڕ فرمێسك و دڵی پڕ خەمەوە شتیان و کفن و دفنیان کردو هەواڵیان نەدا بە حەزرەتی محمد ﷺ.

بۆ نوێژی بەیانی، خزمێکی طەلحە هەواڵی مردنی گەیاندە حەزرەت ﷺ، ئەویش زۆر دوعای بۆ کردوو پاشان خۆی و چەند هاوەڵێکی چوونە سەر گۆڕەکەیو نوێژیان لەسەر کردوو دوعای زۆری تری بۆ کرد، لەیەکێ لەدوعاکانیدا فەرمووی: (خوایە بەڕووی خۆش و پێکەنینەوە پێشوازی لە (طەلحە) بکە، تا

ئەویش لەخزمەتتدا پێ بکەنێ و ڕووی خۆش و دڵشاد بێت)
قصص من حياة الرسول واصحابه) ص٧ محمد علي دوله.

## شەشەم: پیاوێکی دەشتەکی:

ئەنەس خوای لێ ڕازی بێ بۆمان دەگێڕێتەوە کە عارەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسی: کەی قیامەتە؟ ئەویش فەرمووی: باشە چیت بۆ ئامادە کردووە؟ وتی: نوێژو ڕۆژوو خێرو چاکەی زۆرم ئامادە نەکردووە بۆی، بەڵام دەست مایەی دەستم ئەوەیە کەخواو پێغەمبەری خوام ﷺ خۆش دەوێ ئەویش فەرمووی: دەتۆ لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبی کە خۆشت دەوێن..

ئیتر پیاوە دەشتەکی‌یەکەو هاوەڵانیش کە ئەمەیا ن بیست لەخۆشی‌دا خەریك بوون باڵ بگرن.. چونکە هەموویان خۆشەویستی‌یەکەیان ئەوەندە زۆر بوو قوڵپی دەدا..

## حەوتەم: دکتۆر محمد اقبال:

خۆشەویستی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بەدرێژایی مێژووی ئیسلام دڵ و دەروونی موسڵمانانی ئاوەدان کردۆتەوە، نموونەش لەسەر ئەم ڕاستی‌یە لەژمارە نایەت، بۆیە سەدەکانی پێشو واز لێ دەهێنین و دێینە سەر سەدەی بیستەم و دەچینە خزمەتی دکتۆر(محمد اقبال)شاعیرو فەیلەسوفی موسڵمانی هیندی، کە لەهەموو ژیانی‌دا ئاواتی ئەوە بوو سەردانی مەککەو

مەدینە بکات و شاد بێت بەماڵی خواو جێ نزرگەی حەزرەتی محمد ﷺ.. بەلام بەهۆی باری قورسی ژیانی و سەرقاڵی زۆریو لاوازیو نەخۆشی دوا رۆژەکانی تەمەنی نەگەیشت بەو ئاواتەی کە لەسەرتاسەری ژیانیدا خەوی پێوە دەبینی..

بۆیە لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا هەر ناوی پێغەمبەر ﷺ ببرایە دڵی پڕ دەبوو لەگریان و هەستو سۆزو خۆشەویستییەکەی دەهەژا و زۆری لەخۆی دەکرد کە فرمیسکەکانی بشارێتەوە...

دکتۆر محمد اقبال شاعیرێکی هەست ناسکی بەتوانا بوو، بەخەیاڵ چوو بۆ زیارەتی مەککە و مەدینەو بەکامی دڵ بەمەنزل و مەقامو جێو ڕێی پێغەمبەرﷺو یاراندا هاتوو چوو، ئەم گەشتە خۆشە پڕ جۆشەی بەهۆنراوەیەك دەربڕی، کە یەکێکە لەشاکارەکانی و ناوی نا (دیاری حیجان)، تاوەك دیاری یەك پێش کەش بەدۆست و هاوەڵان و گشت موسڵمانانی بکات...

دکتۆر ئیقبال هەواڵی موسڵمانان دەداتە حەزرەت ﷺ و چەند لایەنێکی ژیانیانی بۆ باس دەکات و دەڵێت:

١) چیت بۆ باس بکەم ئەی پێغەمبەری خواﷺ، لەبارەی ئازارو ناڕەحەتی موسڵمانانەوە، ئەوەندە بەسە کە بڵێم، ئەوان لەبەرزاییەکی زۆر بەرزەوە کەوتونەتە خوارەوە، لەو بەرزاییەوە کە موسڵمانان گەیشتن پێی لەسەر دەستا.. دیارە هەرچەندە ئەو شوێنەش بەرز تر بێت ئازاری زیاتر دەبێت و (صدمە) کە

گەورەتر دەبێت، جا مەگەر لوتفی خوا فریای ئەم ئوممەتە بکەوێت کە لەو لوتکە هەرە بەرزەوە کەوتۆتە خوارەوە.

٢) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمانان سەرگەردان بوون لەبیابانی کاکی بەکاکی وشك و برنگدا، بەهۆی ئەوەی کە ئەو پەراوەی فەتحی دنیایان پێ کرد، ئەمڕۆ لەکەلاوە کۆنێکدا و لەسەر تاقێك دایان ناوە، تۆزو خۆڵ خواردویەتی و جاڵجاڵۆکە تەلیسمی بەدەوردا تەنیوە...

٣) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺجاران کەموسڵمانان پیشەوایان هەبوو، وەدەیان زانی چۆن بەیەك ریز لەحزوری خوادا بوەستن، توانیان یەخەی پاشایانی دنیا بگرن و بیانهێنن بەرەو هەقو راستی، بەڵام ئەمڕۆ ئەو گڕو تین و توانایەیان نەماوەو بێ پێشەوا لەتاریکییەکاندا پەل دەکوتن، هەر کەسەو بۆ خۆی کونجی قەناعەتی گرتووەو دەستی گرتووە بەکڵاوی خۆیەوە با نەیبات.

٤) ئەی پێغەمبەری خواﷺ بەڕۆژهەڵات و رۆژئاوادا گەڕام، بینیم شارو دێهاتەکان جمەیان دێت لەو موسڵمانانەی کە لەمردن دەترسن، ئەو موسڵمانانەش کە مردن لێ یان دەترسێ هەر چیم کردو گەڕام نەم بینین.

پاش ئەوەی دکتۆر اقبال سەربووردێکی خێرایی مێژووی موسڵمانان باس دەکات دەڵێت:

(خۆلاسەی قسە ئەوەیە ئێمە شایانی تۆ نین ئەی پێغەمبەری خواﷺ..)

٥) ئینجا دکتۆر باسی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺدەکات و دەڵێت(من نەفسو ویژدانم نەفرۆشت بەکەس، پشتم نەبەست بەکەس بۆ چارەسەری کێشەکانم، چونکە من تەنها جارێك پشتم بەغەیری خوا بەست، لەپلەو پایەی خۆم دابەزیم و سەد جار سزادرام..

من بەئاگری شەوق و خۆشەویستی دەسوتێم، سەرم سوڕ دەمێنێ لەم سەردەمەی کە تیا دەژیم و هیچ (دڵسۆزی) تیانەماوەو تەنها باوی ماددیاتە، من غەریبم لەڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا، بەتەنها دەژیم، بۆخۆم گۆرانی خۆشەویستی دەڵێم، لەگەڵ خۆمدا قسە دەکەم، بەمەش ئازارو ئەشکەنجەکانم کەم دەکەمەوە..

تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺفەرمانت بەمن دا، کە نامەی ژیان و (خالیدیان) پێ رابگەیەنم و بەهۆنراوەکانم گیانی هەوڵو کۆششو کۆڵ نەدانیان تیا سەوز بکەم، کەچی ئەودڵ رەقانە داوای لاوانەوەی مردوو لەمن دەکەن لەهۆنراوەکانمدا...

بـەڵێ..دکتـۆر ئیقبـاڵ لەژیانی‌ـدا زۆر سـوود لـە (جـلال الـدین رومـی)وەرئەگـریێو لێیـەوە فێـری مانـای خۆشەویـستی و رۆح بەرزی دەبێت.. ئینجا کە سەیری خراپی حاڵی موسڵمانانیش دەکات هـەمووی دەگێرێتـەوە بۆ ئـەوەی کە لـەمانای خۆشەویستی تێنەگەیشتوون. (پـەڕاوی الطریـق الی المدینـة / ابـو حسن النـدوی) ئەوە پوختەیەکی باسەکانی دکتۆر ئیقباڵ بوو، دیارە ئەوەی کە خۆی بەهۆنراوە وتوویەتی زۆر بەهێز ترو بەپێز ترە).

## چەند ئایەتێکی قورئان و هەڵوێستەیەك

١) خوای پەروەردگار کە باسی چیرۆکی گەلی (لوط)دەگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ لەکاتی باسەکەدا، سوێند دەخوات بەژیان و تەمەنی و دەفەرموێت: ﴿لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾﴾الحجر: ٧٢ - ٧٤ ،

واتە: سوێند بەژیان و تەمەنی تۆ ئەی (محمد ﷺ)، ئەوانەوان لەسەر .

٢) خۆشیو گومڕایی خۆیاندا، لەکاتێکدا سەرگەردانن و چاوی دڵیان نابینایە..بۆیە لەناومان بردن بەدەنگێکی گەورە

لەکاتیخۆرهەلاتن‌دا، وە زێرەو ژوورمان کردن و، وردە بەردمان بەسەردا باراندن، ئەمە بەڕاستی بەڵگەو نیشانەیە بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوەو ورد ببنەوە، وە بێگومان جێ و ڕێ یان کەوتۆتە سەر ڕێگای کاروانەکانەوەو بەڕاستی ئایەت و بەڵگەو پەندە بۆ بڕواداران.

٣) هەروەها خوای پەروەردگار ئەمەندە دلی پێغەمبەری ﷺلامەبەستە، بۆیە سوێند دەخوات بەو گلەییەی کە پێغەمبەرﷺ دەیکات و دەفەرموێت:﴿وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمٞ لَّا يُؤۡمِنُونَ ۝ فَٱصۡفَحۡ عَنۡهُمۡ وَقُلۡ سَلَٰمٞۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ۝﴾الزخرف: ٨٨ - ٨٩

واتە: سوێند بێت بەو گلەییەی کە (محمدﷺ) دەیکات لەگەلەکەی و دەفەرموێت:

پەروەردگارا بەڕاستی ئەمانە گەلێکن باوەڕ ناهێنن، ئەی محمدﷺ گوێیان مەدەرێ و لێیان گەڕێ، لەمەو پاش دەزانن چییان بەسەر دێت).

ئینجا خوای گەورەی خاوەن دەسەلات پاش ئەو هەڕەشە سەختەی کردی لەو کۆمەڵە بەدبەختە، لەغەزای بەدرو غەزاکانی دیکەدا لەماوەی چەند ساڵێکدازۆر بەیانی لەناو برد، ئەمە دنیایان، ئاشکراشە قیامەتیشیان زۆر سەخت ترو دژوارتر دەبێت..

٤) قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ المائدة: ٦٧.

واتە: ئەی فروستادەی خواﷺ رایگەیەنە بەمەردومان هەرچی نێرراوە.

٥) بۆت، وە ئەگەر هەمووی بەچاکی ڕانەگەیەنیت مانای وایە پەیامەکەت نەگەیاندووە، باکت لەکەس نەبێت چونکە خوا تۆ دەپارێزێ لەخەڵکی، لەدەستی چەپەڵی تاوانباران و پیلان گێڕان...

بەڕاستی خوا هیدایەتی گەلی کافران نادات و سەریان ناخات...

ئاشکرایە کە ئەرکی پێغەمبەر ﷺ ئەرکێکی زۆر گران و سەخت بوو، بەڵام خوای پەروەردگار دەستی دایە باڵی، کاری بۆ ئاسان کرد، کۆڵ نەدان و ئارام گرتنی پێ بەخشی.

لەو کاتانەی کە ئیتر مرۆڤ دەستەو سانەو هۆکارە دنیاییەکان تیایا دەوەستن، خوای گەورە بە ئاشکرا سەربازانی کەس نەدیوی خۆی دەنارد، ئاشکراشە کەچی لەئاسمانەکان و زەویدان سەربازی خوان..

قورئانی پیرۆز دەفەرمویت:﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾ التوبة: ٤٠.

واتە: ئەگەر ئێوە پێغەمبەر ﷺ سەر نەخەن، ئەوە خوا پەکی ناخات و هەر خۆی سەری دەخات، هەروەك چۆن (یەکەم) سەری خست لەکاتی دەرچوونیدا لەماڵی خۆی لەمەککە لەکاتی هیجرەتدا کە کافرەکان بەشمشێرەوە دەوری ماڵەکەیان تەنی بوو، خوای گەورە کەڕو کوێری کردن و بەسەلامەتی بەناویاندا تێپەڕی...

(دووەم) سەری خست لەناو ئەشکەوتەکەدا خۆی و هاوەڵەکەی، کەکافرەکان بەهۆی کەسێکی شارەزا لەناسینەوەی جێ پێدا هاتنە بەردەم ئەشکەوتەکە..کابرای شارەزا وتی ئەمە جێ پێی (محمـــد)ە کــە هـــەروەك جێپێکـــەی ئیبراهیمـــە لەســـەر بەردەکە(مقامی ابراهیم) لەبەردەم کەعبەدا، وەئەمەی تریشیان جێپێی ئەبوبەکرە یان جێ پێی کوڕەکەیەتی، جا لەم شوێنە نەترازاون، یا چوونەتە ئاسمان، یان چوون بەناخی زەویدا،

بەمەرجێك لەناو ئەشکەوتەکەی بەردەمیاندا بوون و سەیری بەرپێی خۆیان بکردایە دەیان بینین.. بەڵام کە خوا ویستی نەبینرێن ...چ چاوێك حەددی بینینی هەیە ؟!

سێهەم سەر خستنیشی ئەو ورە بەرزە بوو کە خوا دابووی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کاتێك بەهاوەڵەکەی فەرموو مەترسە، تۆ رات چییە بەرامبەر دوو کەس کە خوای گەورە سێهەمیانە...ئنجا خوای گەورە دڵی ئەبوبەکری ئارام کردو سەری خستن بەلەشکرو سەربازێك کە ئێوە نەتان ئەبینن...خوای گەورە وشەو پیلانی کافرانی ژێر خست و، وشەی خواو بەرنامەی خواش هەمیشە بەرزو بڵندە.. بەڕاستی خوا زاڵ و بەدەسەڵات و کار دروستە..

بەڕاستی هەموو هەژارو داماوین و ئاتاجمان بەیارمەتی خوا هەیە، خوا دەوڵەمەندو بەدەسەڵاتەو پەکی لەکەس نەکەوتووە، قورئان زۆر جار ئەم راستییە ئەدات بەگوێی خەڵکی بەگشتیو موسڵمانان بەتایبەتی، تاوەکو بزانن کەئەمان کاسبی بۆ خۆیان دەکەن، قیامەتی خۆیان باش دەکەن. هەروەك دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾﴾ فاطر: ١٥.

واتە: خەڵکینە هەر ئێوەن بێ نەواو داماو کە هەردەم پێویستیتان بەخوایە، وەتەنها خوایە دەوڵەمەندی

راستەقینە کە پەکی لەکەس نەکەوتوەو هەردەم سوپاس کراوە لەسەر بەخششی زۆری... ئەگەر بیەوێ ئێوە لەناو دەبات و خەڵکانێکی تر دێنێتە سە رگۆڕەپانی ژیانەوە، کە لەئێوە چاکتر بن.. وەئەوەش لەسەر خوا گران نیە.. مەگەر بەردەوام نەوەیەکی نوێ جێی نەوەکانی پێشوو ناگرێتەوەو هەر رۆژەی دنیا بەدەست کۆمەڵە کە سێکەوە نیە؟.. وە هەروەك وتراوە (لو دامت لغيرك ما وصلت إليك) ئەگەر بۆ ئەوانەی پێش تۆ بمایە دەست تۆ نەدەکەوت.. دەی ئیتر بۆ پەند وەرناگرن ؟!..

٤)قورئانی پیرۆز لەپەروەردەکەیدا گرنگی زۆر دەدات بەڕێز گرتنی پێغەمبەرﷺ لەلایەن موسڵمانانەوە هەروەك دەفەرموێت:
﴿لَّا تَجۡعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيۡنَكُمۡ كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضٗاۚ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمۡ لِوَاذٗاۚ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾ النور: ٦٣. واتە: هەروەك چۆن یەکتری بانگ دەکەن ئاواش پێغەمبەرﷺ بانگ مەکەن، ڕێزی زۆری بگرن، (بەناوی خۆیەوە بانگی مەکەن، دەنگ بەرز مەکەنەوە لەخزمەتیا) بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو کەسانەی کە خۆیان دەدزنەوە لە ئیشو کارو مۆڵەت وەرناگرن لە پێغەمبەر ﷺ، وەخۆیان دەدەنە پاڵ ئەو کەسانەی کەمۆڵەت وەردەگرنو بەدزییەوە خۆیان قوتار دەکەن.. جا ئەوانەی کە سەرپێچی

دەکەن لەفەرمانی پێغەمبەر ﷺ، با ئەو بەڵاو موسیبەتەیان لەبەرچاو بێ کە دوو چاریان دەبێ لەدونیاو لەقیامەتدا، وەبا خۆیانی لێ بپارێزن...

## سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾﴾الاحزاب: ٤٣.

واتە: خوایە کە رەحمەت و بەزەیی دەڕژێنێ بەسەرتاندا، مەلائیکەکانیشی داوای لێ بوردن و سڕینەوەی گوناهو تاوانیان بۆ دەکەن لە خوا، ئەمەش بۆ ئەوەی لە تاریکایی‌یەکان دەرتان بهێنن بەرەو رووناکی، وەخوا هەمیشە بەبەزەیی‌و میهرەبان بووە بەرامبەر بەموسڵمانان.

لەخوا بەزیاد بێ، ئایا بەندەکانی خوا چی‌یان دەوێ؟ ئایا چ رادەو پلەیەك لەوە بەرزو بڵند ترە؟

ئەم بەندە لاوازە بێ دەسەڵاتە، کە هەموو گیان و لەشی پڕە لەناتەواوی‌و پێویستی، خوا باسیان بکات و خۆی‌و مەلائیکەتەکانی درودو سڵاویان بۆ بنێرن.. وە هەروەك لەحەدیسی قودسی دا هاتووە کە بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە

(خوای پەروەردگار دەفەرموێ: هەر کەس لەدەروونی خۆیدا باس و یادم بکات، منیش لای خۆم باسی ئەکەم، هەر کەس لەناو خەڵك و کۆمەڵدا باسم بکات و ناوم ببات، منیش لەناو گەل و کۆمەڵێکدا باسی دەکەم کە چاکترن لە گەل و کۆمەڵەکەی ئەو).

بۆ گەیشتن بە (صلوات)ی پەروەردگار قورئان دەفەرموێ:

﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾﴾البقرة: ١٥٥- ١٥٧.

واتە: بەڕاستی تاقی تان دەکەینەوە بەکەمێك لەترس و برسێتی و کەم بوونەوەی

دارایی‌و مەردومو بەروبووم، وەمژدە بدە بەخۆڕاگران، ئەوانەی کە لەگەڵ تووشی سەختی و ناڕەحەتی یەك دەبن دەڵێن، ئێمە هی خواین، هەر ئەو خاوەنمانە، بەفەرمانی ئەو هاتوینەتە دونیاوەو هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، ئەوانە درودو بەخششی خوای خۆیانیان لەسەرە، وە هەر ئەوانن کەڕێی ڕاستیان دۆزیوەتەوە. کەواتە ئارامگری ڕێگای یەکەمە بۆ گەیشتن بەدروودو بەخششی خوایی..

ڕێگەی دووەمیش سەڵاوات دانە لەسەر حەزرەتی محمد ﷺ، کە بەهەر سڵاواتێك خوای گەورەی باڵا دەست، دەجار دروودو بەخششی خۆیمان بەسەرا دەبارێنێ ...

قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ۝﴾الأحزاب: ٥٦.

واتە: بەڕاستی خوای پەروەردگارو مەلائیکەتەکانی سەڵاوات ئەدەن لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئەی کەسانی کەبڕواتان هێناوە سەڵاوات بدەن لەسەری و سەلامی لێ بکەن بەسەلام لێ کردنێکی گرنگ..سەڵاواتی خوا لەسەر پێغەمبەر ﷺ وەسف و سەناو باس کردنیەتی بەچاکە لەناو کۆمەڵی هەرەبەرزی مەلائیکەتداو بارینی ڕەحمەت و میهرەبانییە بەسەریدا، وەپایەدار کردنێتی لەدونیاو قیامەتدا.

سەڵاواتی مەلائیکەش نزا کردنیانە بۆی لای خوا کە هەردەم پایە بەرزی بکات و ڕەحمەت ببارێنێ بەسەریدا.. سەڵات و سەلامی ئیماندارانیش ئەوەیە کە داوا لەخوای پەروەردگار بکەن کەسەڵات و سەلام بڕژێ بەسەر گیانی پێغەمبەرداو ﷺ لەدنیاو قیامەتدا پایە بەرزی بکات.

ئەمە پلەی بەرزی پێغەمبەرە ﷺ لای خوا، هەر کەس ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدات وەك ئەوەیە ئازاری خوای دابێت، بەوەش

خوا لەعنەتی لێ دەکات لەدنیاو لە ئاخیرەتداو سزایەکی سەختی دەدات، هەروەك دەفەرمویت:﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٥٧﴾﴾

الاحزاب: ٥٧.

پێغەمبەر ﷺ باسی گرنگی سەڵاوات دانمان بۆ دەکات و دەفەرموێت:

أ) (من صلى عليَ صلى الله عليه بها عشرا) مسلم گێڕاویەتیەوە...

واتە / هەر کەسێ یەکجار سەڵاوات لەسەر من بدات خوای گەورە دەجار سەڵاوات لەسەر ئەو دەدات و رەحمەت و بەرەکەت دەبارێنێ بەسەریا.

ب) (أولى الناس بي يوم القيامة أكثرهم علي صلاة) ترمذی گێڕاویەتیەوەو (حسن)ە.

واتە/ لەپێشترین و نزیکترین کەس لەمنەوە لەقیامەتدا ئەوانەن کە سەڵاواتم زۆر لەسەر دەدەن.

ج) (صلوا علي، فإن صلاتكم تبلغني حيث كنتم) ئەبو داود گێڕاویەتەوە صحیح.

سەڵاواتم لەسەر بدەن، دڵنیا بن لەهەر کوێ بن، نزیك یان دوور سەڵاواتەکانتان پێم دەگات..

د) (مامن أحد يسلم عليَ إلا رد الله علي روحي حتى أرد عليه السلام) ئەبو داود گێڕاویتەوە (صحيح)ە.

واتە: هەر کەسێ سەلامم لێ بکات، خوای گەورە لەقەبرەکەمدا رۆح دەکاتەوە بەبەرمدا تاوەڵامی سەلامەکەی بدەمەوە.

هـ) (إن من أفضل أيامكم يوم الجمعة، فأكثروا علي من الصلاة فيه، فإن صلاتكم معروضة علي، قالوا: يارسول الله كيف تعرض صلاتنا عليك وقد أرمت؟ قال: يقول: بليت قال: ان الله حرم علي الارض أجساد الانبياء) ئەبوداود گێڕاویەتیەوە (صحيح)ە.

واتە: رۆژی هەینی لە رۆژە هەرە باشەکانتانە، سەڵاواتم زۆر لەسەر بدەن چونکە سەڵاواتەکانتان پێم دەگاتەوەو رادەنوێنرێ بۆم... یارانیش فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا؟ تۆ لەگۆڕدا جەستەت پۆرتکاو لاشەت رزی چۆن سەڵاوات و دروودی ئێمەت پێ دەگاتەوە؟

ئەویش فەرمووی: خوای گەورە جەستەی پێغەمبەرانی لەزەوی حەرام کردووەو لەشیان لەخاکا ناڕزێ... (لەبەر ئەمەشە کە پێنج جار هەوڵی دزینی لاشەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ دراوە خوا هەوڵەکانی پوو چەڵ کردۆتەوە، هەروەك لەدوایدا باسی دەکەین).

# گەورەیی پێغەمبەر ﷺ

١) پێغەمبەر ﷺ باسی خۆیمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: (بعثت من خير قرون بني آدم قرنا فقرنا، حتى كنت من القرن الذي كنت فيه) بخاری گێڕاویەتیەوە.

واتە: چەرخ بە چەرخ و پشت بەپشت بەپاکی و باشی هاتوومەتە خوارەوەو باوو باپیرم لەهەموو سەردەمێکدا لەباشترین چینی ئادەمیزادی ئەو سەردەمە بوون، تا گەیشتوومەتە ئەم چەرخەی خۆم کە خوا رەوانەی کردووم و کردوومی بە پێغەمبەر.

٢) هەروەها دەفەرموێت: (أنا سيد ولد آدم يوم القيامة، وأول من ينشق عنه القبر، وأول شافع وأول مشفع)موسلیم گێڕاویەتیەوە.

واتە: لەڕۆژی قیامەتدا من سەرگەورەی سەرجەم نەوەی ئادەمم، وەیەکەم کەسیشم کە دەمی گۆڕم بۆ دەکرێتەوەو لەگۆڕ دێمە دەرەوە، وەیەکەم تکا کاریشم، وەیەکەم کەسیشم کە لەلای خودای گەورە تکام گیرا دەبێ.

٣) هەروەها دەفەرموێ: (والذي نفس محمد بيده ليأتين على أحدكم يوم ولايراني، ثم لان يراني أحب إليه من أهله وماله معهم) مسلم گێڕاویەتیەوە.

واتــە: بــەوەی کــە گیــانی محمــدی بەدەســتە، ڕۆژێ دێ بەســەر یەکێکتانا کە نامبینێ، ئینجا حەز دەکات هەموو کەس و کارو ماڵی ببەخشێ و چاوێکی بەمن بکەوێت...

٤) قال أبو موسى الاشعرى ﷺ: (كان رسول الله ﷺ يسمى لنا نفسه اسماء فقال: انا محمد وانا أحمد والمقفى والحاشر ونبي التوبة ونبي الرحمة)موسلیم گێڕاویەتییەوە.

٥) ئــەبو موســـای ئەشــعەری (خــوای لێ ڕازی بێــت گــوتی: پێغەمبــەر ﷺ هەنــدێ لــەناوەکانی خــۆی بــاس دەکــرد بۆمــان و دەیفــەرموو: مــن نــاوم محمــدە، وەنــاوم ئەحمــەدە، وەنــاوم دوا هەمینە چونکە دوایین پێغەمبەرم وەناوم کۆکەرەوەیە، وەناوم پێغەمبەری تەوبەو پێغەمبەری ڕەحمەتە.

# لەش و لارو ڕەنگ و ڕوی پێغەمبەر ﷺ

١) ئیمامی علی خوا لێی ڕازی بێ دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بالاّ بەرزی مام ناوەندی بووە، قژی نەزۆر لولو نەزۆر خاو بوو، سوورو سپی بوو، کە دەڕۆیشت پێی هەڵدەگرت ، وەك لەسەر بەرەو ژێرەوەدا داپەڕێ وابوو، کە ئاوڕی دەدایەوە بەتــەواوی ڕووی تــێ دەکــردی، مــۆری پێغەمبەرایــەتی بــەناو شانیەوە بوو، خۆی دوا هەمین پێغەمبەر بوو، هەتا بڵێی دەست بەخێرو سەخی تەبیعەت بوو، هەتا بڵێی دڵو دەروونی گەورە

بوو، راستگۆو قسە راستی وەك خۆی نەبوو، بۆ نەرم و نیانیش وێنەی نەبوو، چەند بڵێی روو خۆشو ڕەفتار شیرین بوو لەگەڵ خەڵکا، ئەوەی لەناکاو دەیدی یەکسەر سامی لێ دەکرد، بەلاَم ئەوەی ناسیاویی‌و دۆستایەتی لەگەڵ بگرتایە خۆشی دەویست ! ئەوەی بیەوێ باسی ناونیشانی ئەو بکا کورتو پوخت دەڵێ: نەبەر لەخۆیو نە لەپاش خۆی کەسی ترم نەدیووە وێنەی ئەو ئاوا شێوەی شیرین و رەفتار جوان بێت... درودو سلاوی خوای لەسەر بێ.

٢) جابیری کوڕی سەمورە(خوای لێ رازی بێ) گوتی: هەندێ مووی سپی لە پێشە سەرو ریشی پێغەمبەردا ﷺ هەبوون، کە چەوری دەکرد دیار نەبوون، بەلاَم کەسەری دەژاکا مووە سپی‌یەکان دەردەکەوتن، مووی ریشی پڕ بوون، رووی وەك خۆرو مانگ خڕو گەش و جوان بوو.

٣) ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: هەرگیزاو هەرگیز بۆنی هیچ شتێکم نەکردووە(نەعەنبەرو نەمیسك ونەهیچی تر) کە بۆنی لەبۆنی پێغەمبەر ﷺ خۆشتر بووبێ، وەهەرگیز دەستم لە هیچ شتیك نەداوە(نەدیباج و نەئاوریشمو نەشتی تر) کە وەك جەستەی پێغەمبەر ﷺنەرمو ناسك بێ..

٤) ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ماڵمان لەوێ سەرخەوی نیوەڕۆی شکان، کەخەوی لێ کەوت ئارەقی دەردا، جا دایکم شوشەیەکی هێناو بەدەستی عارەقەکەی دەچۆڕانە ناو شوشەکەوە، پێغەمبەر ﷺ خەبەری

بۆوە فەرمووی: ئەی دایکی سولەیم: ئەوە چی دەکەی؟ گوتی: ئەمە ئارەقی تۆیە، دەیکەینە ناو گولاوی خۆمانەوە، ئەمە لەگولاو گەلێ بۆنی خۆشترە.(پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەدا کە عەرەقەکەشی بۆنی خۆش بووە کە بڕوا ناکەم هیچ کەس وا بوو بێ، بۆنی خۆشیشی زۆر دەدا لەخۆی، ئەمەش بۆ ئەوەی سەرمەشق بێت بۆ موسڵمانان و ئەم لایەنەش بەگرنگ بگرن).
٥) عائیشە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قسەی بەشێنەیی دەکرد، بواری دەدا، بەشێوەیەکی وا قسەی دەکرد ئەوی لەلای دادەنیشت لەبەری دەکرد.
٦) جابیری کوڕی سەموورە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆر بێ دەنگو کەم دوو بوو، کەمیش پێ دەکەنی، پێکەنینیشی زەردەخەنە بوو، کە تەماشات دەکرد لە تۆ وا بوو کە چاوی رێژاوە، بەڵام خۆی چاو رەش بوو..
٧) ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەهەموو کەسێ چاکتر بوو، وەلەهەموو کەسێ بەخشندە تر و ئازاتر بوو، دەساڵی رەبەق خزمەتم کرد، هەرچیم کردبێ، نەیفەرمووە ئەمەت بۆ وا کردووەو ئەوەت بۆ وا نەکردووە...
٨) هەروەها دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەرتاش سەری دەتاشی، یارانی خەرمانەیان لێ دابوو، هەر تاڵە موویەك بەردە بۆوە یاران دەیان قۆستەوەو دەکەوتە ناو دەستی یەکێکیانەوەو (بۆ پیرۆزی هەڵیان دەگرت..ئێستاش چەند تاڵە موویەکی لە متحفی تورکیا هەیە هەڵگیراوە، وەلەبەرئەوەی لاشەی پێغەمبەران ناڕزێ،بۆیە

تا ئێستا مووەکان وەك خۆیان ماون، هەرچەندە موو تەمەنێکی دیاری کراوی خۆی هەیەو ئەویش دەبوایە نەمایە...)خۆش بەختانە لەکوردستانی ئازیزی خۆیشماندا چەند تاڵە موویەك لەڕیشی پیرۆزی ئەو زاتە هەیە لە هەورامانوتا ئێستا پارێزراوەو هەڵگیراوە.

# دڵسۆزی پێغەمبەر ﷺ

.خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة: ١٢٨

واتە: بەڕاستی هاتووە بۆتان لەلایەن خواوە، پێغەمبەرێك لەخۆتان، زۆر ناخۆشو گرانە لەسەر دڵی ئازارو ناڕەحەتیەکانتان، زۆر بەپەرۆشە بۆتان وبۆ هەموو بڕوادارێکیش دڵسۆزو میهرەبانە...

پێغەمبەر ﷺ خۆی دەفەرموێ: (لكل نبي دعوة مستجابة، فتعجل كل نبي دعوته وإني اختبأت شفاعةلأمتي يوم القيامة فهي نائلة_ان شاء الله _ من مات من امتي لايشرك بالله شيئا).بخاری وموسلیم و ترمذی.

واتە: هەموو پێغەمبەرێك نزاو پاڕانەوەیەکی تایبەتی هەیە، کە خوا گیرای دەکات لێی، هەمووان نزاکەی خۆیانیان لەدنیادا کردووەو گیرا بووە، بەڵام من نزاکەی خۆمم هەڵگرتووە بۆ ڕۆژی قیامەت، لەوێ تکای پێ دەکەم، بۆ ئوممەتم، ئیتر ئەوەی لە ئوممەتم لەسەر ئیمانو باوەڕ بمرێ و هاوبەش بۆ خوا پەیدا نەکاخودا حەزکا ئەوە ئەو کەسە بەر ئەم تکاو شەفاعەتەی من دەکەوێ..

هەروەها عەبدوڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر ﷺئەم ئایەتەی خوێندەوە کە حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) تیای دا دەفەرموێ:﴿رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾﴾ إبراهيم: ٣٦

واتە: خوایە ئەو بتانەو ئەم پەرستراوە ناهەقانە خەڵکێکی زۆریان گومڕاو سەرگەردان کردووە، دەی هە رکەسێ کە پەیڕەوی من دەکا ئەوە لەدەستەی منە،وەئەوەی لە من یاخی دەبێ ئەوە بەرەو ڕووی خۆتی دەکەمەوە و تۆش تاوانبەخش و میهرەبانی، لێی خۆش دەبی یان سزای دەدەی ئەوە مەیلی خۆتە... ئینجا فەرموودەکەی حەزرەتی عیساشی

خوێندەوە(سەلامی خوای لێ بێ) کە دەفەرموێ: ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ۝﴾ المائدة: ١١٨

واتە: خوایە، ئەمانە هەرچەند تاوان بارن، بەڵام بەندەو عەبدی خۆتن، ئەگەر سزاو ئازاریان بدەی ئەوە ڕەوایە بۆ تۆ، وەئەگەر بەکەرەم و لوتفی خۆت تاوانیان بپۆشی ئەوە بەڕاستی تۆ بالآ دەست و کار دروستیت...ئینجا حەزرەت ﷺ هەردوو دەستی خۆی بەرزکردەوەو فەرمووی: خوایە، ئوممەتەکەم، ئوممەتەکەم..ئینجا دەستی کرد بەگریان ...

خوای پەروەردگاریش فەرمووی: ئەی جوبرائیل بچۆ بۆ لای محمد(هەرچەند خودای تۆ خۆی باشتر دەزانێ ـ لێی بپرسە بۆچی دەگری.. جا کە جوبرائیل هاتو لێی پرسی، حەزرەت ﷺ پێی گوت(ئوممەتەکەم، ئوممەتەکەم) _دیارە خوا خۆی باشتر حاڵەکە دەزانێ _ئەوجا خوا فەرمووی: ئەی جوبرائیل ! بڕۆ بۆلای محمد پێی بڵێ: کە خوا دەفەرموێ خەفەت مەخۆ ئێمە دەربارەی ئوممەتت ڕازیت دەکەین و دڵت ناشکێنین. موسلیم گێڕاویەتییەوە.

# دارو بەردو خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ

خوای پەروەردگار هەروەك بیەوێ لەسەرەتاوە پێغەمبەر ﷺ وردە وردە رابهێنێ‌و ئامادەی بکات بۆ وەرگرتنی وەحی، زۆر خەوی پیشان دەدا وەك رۆژی روونـاك دەهاتنـە دی، ئاشـکرایە کـە خەوی راستی(مستقبلی) بەشێکە لە (٤٦)بەشی وەحی..

هـەروەها کاتێـك بـەرێگادا دەرۆیـشت بـەردو شـاخ سـەلامیان لێ دەکرد، ئەمـەش بـۆ ئـەوەی لەپلـەو پایـەی خـۆی تـێ بگـاو بزانـێ کەلـەم بوونـەوەرەدا هـەموو شـتێك بەنـدەی خـوان و تەسـبیحاتی خوا دەکەن..

پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت (إنـي لاعـرف حجـرا بمكـة كـان يـسلم علي قبل ان ابعث اني لأعرفه الان) موسـلیم و ترمـذی ریوایـەتیان کردووە. واتە: بەردێ هەیە لە مەککە دەیزانم، بەر لەوە بکرێم بە پێغەمبەر ئەو بەردە سڵاوی لێ دەکردم، ئێستا دەزانم کام بەردەیە.

هەروەها ئیمام عەلی (خوای لێ رازی بێ) دەفـەرموێ: جـارێ لـە مەککە لەخزمەتی پێغەمبەرداﷺ دەرچووین بۆ شوێنێ، لەرێگە تووشی هـەر شـاخو هـەر درەختـێ دەبـوو، بـەزمانێکی رەوان دەیگـوت: سـڵاوت لێ بـێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا...(ترمـذی گێراویەتیـەوە) ل٢٤٤_٢٨٦ (التـاج الجـامع الاصـول) وەرگێرانـی مامۆسـتا نـوری فارس، بەرگی چوارەم.

هەروەها جابیری کوڕی عبدالله ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێت، لەسەفەر هاتینەوە لەگەڵ حەزرەتدا ﷺ چوینە باخ و بێستانێکی (بنی النجار)ەوە، کە حوشترێکی تیا بوو، بەلەسە بوو بوو هەرچی بچوایە بەلایدا پەلاماری دەدا، ئەمەیان بە پێغەمبەر ﷺ وت و داوای چارەسەرێکیان لێ کرد، ئەویش چووە باخ و بێستانەکەوەو بانگی حوشترەکەی کرد، حوشترەکە هاتە بەردەمی‌و بەچۆکا هات و ملی کەچ کرد..ئینجا حەزرەت ﷺ فەرمووی لغاوەکەیم بۆ بهێنن، بەو جۆرە لغاوەکەی کردەوە ملی و دایەوە دەست خاوەنەکەی‌و فەرمووی: (إنه ليس شيئ بين السماء والارض الاَ يعلم أني رسول الله، الا عاصي الجن والانس) (ئیمام ئەحمەدو دارمی طبرانی)گێڕاویانەتەوە.. واتە: بەڕاستی هیچ شتێك نییە لەنێوان ئاسمان و زەویدا مەگەر دەزانێ کە من نێرراوی خوام، تەنها سەرپێچی کەرانی جین و ئینس نەبێ.

لاپەڕە (١٨) محبه النبی، وە لەبارەی خۆشەویستی شاخی ئوحودەوە حەزرەت ﷺ دەفەرموێ: (إن احداً جبل يحبنا ونحبه) بخاری گێڕاویەتیەوە واتە: بەڕاستی ئوحود شاخێکە ئێمەی خۆش دەوێ‌و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێ.

پێش ئەوەی مینبەر بۆ پێغەمبەر ﷺ دروست بکەن، پێغەمبەر ﷺ بەپێوە وتاری ئەداو دەستی موبارەکی دەخستە سەر بنکە

دار خورمایـــەك (کـــە لـــەلای راســـتی میحرابەکـــەی ئێـــستای پێغەمبەرەوە بووە).

هـاوەڵن مینبـەرێکیان بـۆ حـەزرەت ﷺ دروسـت کـرد، جـا ڕۆژی جومعە کە حەزرەت ﷺ لەماڵەوە هاتە ناو مزگەوت و بە بنکە دار خورماکەدا تێپەڕیو چووە سەر مینبەرەکە، بنکە دار خورماکە غوربـەتی هەسـتاو دڵـی پـڕ بـوو، وەك منـداڵ بـەدوای دایکیـدا بگـری، ئـاوا بـەدوای پێغەمبـەردا ﷺ، لەبـەر چـاوی گـشت نوێژکەرەکان دەستی کـردە گریـان و کوڵی گریـانی نەنیـشتەوە هەتا حەزرەت ﷺ لەدوانگەکەی دابەزیو چوو بۆلای و دەستی کردە ملی و ئاشتی کردەوە...

ئەی هاوار بۆ حاڵی ئێمە..بنکە دار خورمایەکی وشکی بێ گیـان بتـاڵێنێ بۆ دووری فەخری عالـەم ﷺ، ئـەبێ ئێمە چۆن رووماـن بێ سـەر بەرز بکەینـەوەو خۆمـان بـە ئوممـەتی بزانین، ئایـا ئەمـە وانەیـەك نییـە لەخۆشەویـستیدا کـەخوا ویـستویەتی فێـری موسـڵمانانی بکـا ؟ ئایـا ئەمـە پەنـدو عیـبرەت نییـە بـۆ موسڵمانان تا لەهەموو کاتو شوێنێکداو لەیادی ئەم باسەدا بەخۆشەویستی یەکەیاندا بچنەوەو هەروەك بێخود بڵێن:

حەیاتی من ویصالی تۆ مەماتی من فراقی تۆ

بەتیکە تیـکەبێ دڵێ کە نەیبێ اشتیاقی تۆ

شێخ حەسەنی بەصری ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێ: موسڵمانینە، بنکە دارخورمایەك دەناڵێنێ بۆ پێغەمبەر ﷺ، وەشەوقی هەیە بۆ دیداری، مەگەر ئێوە لە پێش تر نین کە شەوقتان هەبێ بۆ گەیشتن بە دیداری ئەو خۆشەویستە ﷺ.

ئیمام شافعی دەفەرموێت: خوای گەورە بنکە دارێکی والّی کرد کە بۆ محمد ﷺ بناڵێنێ، کە ئەمەش بەڕاستی لە مردوو زیندوکردنەوەکەی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) زۆر گەورە ترە...(ل ٢٦ محبة النبی وطاعته)..

## خەوبینین بە پێغەمبەرەوە ﷺ

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (هەر کەسێ لەخەویدا من ببینێ، ئەوە خەوێکی راستو دروستی دیوە، ئەو کەسەی لەو خەونەدا دیویەتی من بووم، چونکە شەیتان خۆی بۆ ناکرێت بەمنو ناتوانێت بچێتە شێوەی منەوە) بوخاری گێڕاویەتیەوە...

زانایان دەڵێن (بەمەرجێ دیتنی پێغەمبەر ﷺ لەخەوندا دادەنرێ بەڕاست، کە شێوەی پێغەمبەر ﷺ لەو خەونەدا نزیك بێ لە شێوەی پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ژیانیدا، وەك لەسوننەتو سیرەت دا روون کراوەتەوە).

خـوای گـەورە زۆر مەبەسـتێتی کـە پەیوەنـدی موسـڵمانان بـەتین بێـت بە پێغەمبـەرەوە ﷺ و لەسـەرو ماڵیخۆیـان زیـاتر خۆشـیان بـویَ... رەنگــە لەبــەر ئەمــەش بێــت کــە بەفــەرمانی خــوای پـەروەردگار زۆر مـژدەو بەشـارەت پێغەمبـەرﷺ بەخـەو دەیـدات بەموسڵمانان...

ئەمەش چەند نمونەیەکە لەسەر ئەو جۆرە خەوانە:

١) مامۆســتا صــالح رشــید کەماجــستێری هەیــە لــەزمانی عەرەبیداو ئێستا لەزانکۆی هـەولێر مامۆستایە دەڵێت: چوومە خزمـەتی (محمد فؤاد عبـدالباقی) لەمیسر، بەڕاسـتی پیـاوی بۆ خوا سوڵاحاو بوو، کاتێك کە (المعجم المفهرس لالفـاظ القرآن)ی دانا، دیارە کە کارێکی زۆر گـەورەو پیرۆزو گـران بـوو، پێغەمبـەر ﷺ(١٤)جار چووە خەوییەوەو ئەو هەڵانەی بۆ راست دەکـردەوە کە لەپەڕاوەکەیدا کردبووی...

شایانی باسە مامۆستا صالح ئەوەندە (متأثر) بوو بەمامۆستا (محمد فؤاد عبدالباقي) کە ئەمەی گێڕایەوە چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك.

٢) مامۆسـتا مـەلا عبـداللهی مزگـەوتی گـەورە، خـوا لێـی خـۆش بێت، پیاوێکی پیاوانەو موسڵمانێکی زۆر چاك و خواناس بـوو، بەڵام بڕوانامەی مەلای دوانزە عیلمی نەبوو...

(بەڕێوەبەرایەتی شئونی ئەوقاف)ی ئەوسا فەرمانێ دەردەکات، گوایە هەرچی مەلای دوانزە عیلم نەبێ نابێ ببێ بەئیمام و دەبێ مەلاکان لەتاقی کردنەوەی تایبەتدا لە بەغدا ئامادەبن بۆ بەدەست هێنانی ئەو بڕوانامەیە ئەگەر نەیان بێت.. مامۆستا مەلا عبداللەش ناچار دەچێت بۆ بەغداو پاش دەرچوونی ئەنجامی تاقی کردنەوەکە دەردەچێ بەپلەی یەکەم...

کەدێتەوە سلێمانی، مامۆستا مەلا عینایەت لێی دەپرسێت: مەلا عبدالله چۆن پلەی یەکەمیت بەدەست هێنا، خۆ تۆ زۆر لەو تاقی کردنەوەیە دەترسایت.. ئەویش فەرمووی" پێغەمبەر ی خوا ﷺ شەوی تاقی کردنەوەکە هاتە خەوم و هەموو پرسیارو وەڵمەکانی پێ وتم..

٣) دۆستێکم بۆی گێڕامەوە کە تا ساڵی ١٩٨٥ ئەوەندە لایەنی رۆحی چاك بوو، هەموو شەوی جومعەیەك بەخزمەت پێغەمبەر ﷺدەگەیشت لە خەوداو بەدیداری موبارەکی پڕ نووری شاد دەبوو.

٤) مامۆستا منصور علیناصف حەوت ساڵ فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ کۆدەکاتەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ دەچێتە خەوی‌و داوای لێ دەکات کە شەرحیشیان بکات، ئەویش حەوت ساڵی تر خەریکی نووسینی شەرحەکەی دەبێت و بەمەش پەڕاوی (التاج الاصول في احادیث الرسول) چاوی بەدنیا هەڵهانی‌و تا ئێستا

موسڵمانان سوودی لێ وەربگرن و مامۆستا (نوری فارس)یش خوا پایەداری بکات وەریگێڕایە سەر زمانی کوردی.

٥) سوڵتان (قطز) کەفەرماندەیەك بوو لە سوریا پێغەمبەر ﷺ لەخەودا فەرمانی پێدا کە بچێتە میصر، ئەویش چوو، سەرەنجام پاش چەند ساڵێك لەوێ پلە پلە بەرز بۆوە تا کاروباری دەوڵەتی گرتە دەست و تەتەرەکانی تێك شکاندو موسڵمانانی ڕزگار کرد لەو خوێن مژە داگیرکەرانە.

٦) هەندێك لەفەرمانڕەوایانی صلیبیەکان پیلانێکیان دانا بۆ دزینی لاشەی پێغەمبەر ﷺ، لەساڵی ٥٥٧ك، لە زەمانی(نورالدین محمود زنکی)دا..بەهۆی دوو گاوری خەڵکی (مغرب)ەوە کە لەجل و بەرگی حاجی موسڵمانی مەغریبیەوە چونە مەدینەو لەنزیك مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ خانوو یەکیان بەکرێ گرت... زۆر یارمەتی خەڵکیان دەداو خۆیان بەخواناس و پیاو چاك نیشان دەدا، بەشەو بەدزییەوە لەناو ژوورەکەی خۆیانەوە خەریکی (نفق)لێ دان بوون لە ژێر زەوییەوە بەرەو قەبری پێغەمبەر ﷺ، وەئەو خۆڵ و گڵەی دەریان دەدا دەیان کردە بیرێکی گەورەی قوڵەوە کە لەناو حەوشەی خانووەکەدا هەبوو..

نورالـدین محمـود پـاش شـەو نوێـژ کـردن لەخـەودا بەخزمـەت حەزرەت دەگات ﷺ و پێی دەفەرموێت ڕزگارم کە لەدەست ئەم دوو کەسە.. نورالدین بەشپرزەیی‌یەوە خەبەری دەبێتەوە دەست نوێـژ دەشـواتەوەو نوێـژ دەکـات و دەخەوێتـەوە، هـەمان خـەو دەبینێتـەوە، ئـە م جـارەش زیـاتر ئەپەشـۆکێ و دەسـت نوێـژ دەشـواتەوەو پـاش نوێـژکردن دەخەوێتـەوەو هـەمان خـەو بـۆ سێ‌یەم جار دووبارە دەبێتەوە...

ئەویش هەر ئەو شەوە دەنێرێت بەدوای وەزیرەکەی‌دا کە نـاوی (جمـال الـدین الموصـلی) بـوو، وەخەوەکـەی بـۆ دەگێڕێـتەوە، ئەویش دەڵێت قوربان هـەر ئێستا با لەگـەڵ کۆمـەڵێك سـەربازدا بکەوینـە ڕێ بـەرەو مەدینـەو پارەیـەکی زۆریـش لەگـەڵ خۆمـانـدا بـەرین.. پـاش (١٦) ڕۆژ دەگەنـە مەدینـەو (نورالـدین)دەنێرێـت بـەدوای خەڵکی‌دا کە بێن یارمـەتی وەرگـرن.. هەرچـی دێـت بـۆ پـارە وەرگـرتن (نورالـدین) زۆر لی‌یـان ورد دەبێتـەوە ئـەو دوو کەسـە نـابینێ کە لەخەوەکەی‌دا بینیـونی، بۆیـە پرسیار دەکـات کـە ئایـا کـەس مـاوە بێـت ؟ دەڵـێن دوو پیاوی‌خوانـاس مـاون پێویستیان بەیارمەتی نییەو ئەوان دەست گیرۆیی خەڵك دەکەن. کە نورالدین دەچێت بۆ لایان سەیر دەکات ئەو دوو کەسـەیە کـە لەخەوەکەیدا بینیـونی، چـی پرسیاریان لێ دەکات ڕاسـتی نـاڵێن ئینجـا دەیانخاتـە ژێـر سـزاوە، بۆیـە ناچـار ڕاسـتی دەڵـێن و دان ئـەنێن بـەوەدا کـەنێرراون لاشـەی پیرۆزی پێغەمبـەر ﷺ بـەهۆی

نەفەقەوە لە ژێر زەوییەوە بدزن، نورالدینیش هەردووکیان دەکوژێ و پاشان بەدەوری قەبری پێغەمبەرﷺ هەردوو هاوەڵەکەیدا سێ دیواری قایمی قوڵ لەبەردوقورقوشم دروست دەکات تا کەس زاتی ئەوە نەکات کە جارێکی تر بیر لەشتی وا بکاتەوە (تأریخ المسجد النبوی الشریف/ محمد الیاس عبدالغنی).

## خۆشەویستی واتە شوێن کەوتن و گوێرایەڵی کردن:

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾النساء: ٦٤. واتە: هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر بۆ ئەوە نەبێ کە بەفەرمانی خوا

گوێ رایەڵیان بۆ بکرێ... هەروەها دەفەرموێت:﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران: ٣١. واتە: پێیان بڵێ ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ دوای من بکەون و گوێڕایەڵی من بکەن، بەوە خوا خۆشی دەوێن و لەگوناهتان خۆش دەبێت، وەخوا لێ بوردەو میهرەبانە... گەیشتن بەهیدایەت و خۆشەویستی تەواو هەوڵو کۆششو خەباتو (موجاهەدەی)دەوێت، قورئان دەفەرموێت:﴿وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبوت: ٦٩

کاتێك تۆوی خۆشەویستی لە دڵو دەروونندا دەڕوێت وەك هەموو تۆوێکی تری سەر زەوی چاودێری و ئاودانی دەوێ تا چەکەرە دەکاتو سەوز دەبێتو بەرهەم دەدات.

یەکێك لەبەر هەر هۆیەك کە گوناهێکی بچووك یان گەورە دەکات، مانای وانییە هیچ خۆشەویستیەك لەدڵیانیە، ڕەنگە هەبێت، بۆیە چاکتر وایە بێ هیوا نەکرێ و هان بدرێ لەسەر زیادکردنو پەرەپێدانی..وەخواش پێی خۆشە کە دەستی بگیرێو بەرەڵنەکرێ بۆ شەیتان کە زیاتر زەفەری پێ بباتو لەخشتەی بەرێت..

یەکێ لەهاوەڵان لەسەردەمی حەزرەتدا ﷺ (مدمن)بوو لەسەر مەی خواردنەوە، هەرچی دەکرد بۆی تەرك نەئەدرا، بەسەر خۆشی چەندجار ئەیانهێنایە لای حەزرەت ﷺ و ئەویش جەڵدەی لێ دەدا، هاوەڵێك جارێکیان وتی: لەعنەتی خوای لێ بێ، ئەمە نەبڕایەوە ... پێغەمبەر ﷺفەرمووی: لەعنەتی لێ مەکەن، شەیتان بەسەریا زاڵ مەکەن، ئەو خواو پێغەمبەری خۆش دەوێت...

واتە.. تۆ چ سوودیك لەوە وەردەگری کە بەلەعنەت کردن لەڕەحمو میهرەبانی خوا بێ بەری بکەی...بۆ دوعای خێری بۆ ناکەی، ڕاستە هەڵخلیسکاوە بۆ دەستی ناگری هەستێتەوە..خۆ تۆوی خۆشەویستی لەدڵیایەتی بۆ هاوکاری ناکەی زیاتر ببێتو

چـاکتر ببێـت...(لاتلعنـوه فـوالله مـا علمـت انـه یحـب الله ورسوله)بوخاری گێڕاویەتیەوە.
مامۆستا (ئەبوالحسن نەدەوی) لە پەڕاوی (الطریق الی المدینة) دا دەڵێت:

مامۆستا (اختر الشیرانی) شاعیرێکی بەرزی هیندی بوو، لەگەل ئەوەدا کە ئالوودەی مەی خواردنەوە بوو بوو، خواو پێغەمبەری ﷺ خـۆش دەویـست، تەنانـەت بەسـەر خۆشـیش بـێ ئـەدەبی نـەدەکرد بەرامبـەریان..ڕۆژێـك لەمەجلیـسی مـەی خواردنـەوەدا کۆمـەڵێ لاو لـەدەوری مامۆسـتا (اخـتر الـشیرانی) دانیـشتبوون باسـی شـیعرو ئـەدەبیان دەکـرد، لەگەرمـەی باسـەکاندا لاوێکـی کۆمۆنیست ویـستی بیخاتـە هەڵـەوە، لێـی پرسـی رات بەرامبـەر پێغەمبەران چییە؟ئەویش وتی تکایە با لەباسی شیعرو ئەدەب دەرنەچین..جارێکی تر کەوتنـەوە باسـی جیهـانی شیعرو ئەدەب و پرسـیاری رای تایبـەتی مامۆسـتایان دەکـرد لـەبارەی فـلان شاعیرو فیسارو شاعیرەوە..ئەویش یـەك یـەك وەڵـامی دەدانـەوە، هەرچەند تـەواو سـەرخۆش بـوو وە پێکـیێ مـەیش بەدەسـتییەوە بـوو، ئالـەم کاتـەدا لاوێکـی کۆمۆنیـستی تـر لێـی پرسـی: رات چییە بەرامبەر (محمد)؟ ئەویش سـوور بووەوەو زۆر تـوڕە بـوو، پێکـــە عەرەقەکـــەی گرتـــە لاوەکـــەو کردییـــە دەرەوە لەمەجلیسەکە..پاشان شـەو مامۆسـتا بەتـەنها دانیـشت و بـەدەم فرمێـسکی پەشـیمانییەوە دەیـووت: ئـەم مولحیدانـە تـەواو بـێ ئەدەبن، دەیانەوێ بەتەواوی دامان ماڵن لەوەی کە شانازی پێوە

دەکەین، دەیانەوێ بێ بەریمان بکەن لەخۆشەویستی خوا و پێغەمبەر ﷺ..ڕاستە من گوناهبارم..بێ گومان دان بەتاوانم دادەنێم..بەڵام ئەمانە دەیانەوێ بەتەواوی ملوانکەی ئیمان وئیسلام لەملمان داکەنن کە ئێمەش بەخوا هەرگیز بەوە رازی نین...
بەڵێ ئەمە تروسکایی ئیمان و خۆشەویستییە لەدڵدا، ڕاستە خوای گەورە بەهێندەی سەرپێچی و گوناهەکەی لە دۆزەخدا سزای دەدات ئەگەر تەوبەی یەکجاری نەکات، بەڵام مسقاڵە زەڕەیەك ئیمان و خۆشەویستی نایەڵێ (خالید)ببێ و هەتا هەتا لەدۆزەخدا بێت.. کە ئەمەش بۆچوونی ئەهلی سوننەو جەماعەتە کەموسڵمان بەگوناهکردن (معاصی)کافر نابێت..
مامۆستا (ئەبو الحسن نەدەوی)ئەم باسە لەوەوە دەهێنێت کەدەڵێت: فارس و گەلی موسڵمانی هیندستان، زۆر پێغەمبەریان خۆش دەوێت ، زۆر تامەزرۆی دیدارین زیاتر لە موسڵمانە عەرەبەکان کە شارەزای زمانی عەرەبیشن..
وەدەڵێت ...ئەمەندەی کە موسڵمانانی فارس وهیندی هۆنراوەیان لەسەر خۆشەویستی حەزرەتﷺ داناوە ئەوەندە شاعیرە عەرەبە موسڵمانەکان دایان نەناوە، هەروەها مامۆستا (ابو الحسن) دەڵێ: بەشانازییەوە ئێمەی عەجەم سەرخۆشەکەشمان بێ ئەدەبی بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ ناکات(جێگای شانازییە کە شاعیرانی ئێمەی کوردیش دەستێکی بالأیان لەو بوارەدا هەیە).

# دوا ووتە

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ وَأَمۡوَٰلٌ ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٞ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٖ فِي سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾﴾ التوبة: ٢٤.

واتە: ئەی محمد پێیان بڵێ ئەگەر باوکتان و منداڵتان و براتان و هاوسەرتان و عەشیرەتتان و ماڵ و سامانێك کە پەیداتان کردووەو بازرگانییەك کە دەترسن کەم بکات، وە خانوو جێگەتان کە دڵتان پێ خۆشە، لەلاتان خۆشەویسترە لەخواو پێغەمبەرو جیهاد لەڕێی خوادا، ئەوە چاوەڕێی سزای خوابکەن، و خواش هیدایەتی گەلی فاسق نادات..

بەڕاستی هەڕەشەیەکی گەورەیە، ئەگەر خۆشەویستی خواو پێغەمبەرﷺ لە پێش نەفس و هەموو شتێکەوە نەبێتو سەرو ماڵ نەکەن بەقوربانی، ئەوە چاوەڕێی سزای خوابن، چ سزایەك ئەو سزایەی کە لەچەندەها شوێنی قورئاندا بە(مهین) و (الیم) و(عظیم) و... هتد باس کراوە لەلایەن ئەو پەروەردگارەوە کە (عزیز)و (جبار)و (منتقم) و (قهار)ە.

قاضی عیاض دەفەرموێت: ئەم ئایەتە بەسە کە هاندەرو ئاگادار کەرەوە و بەڵگەو حوجە بێت لەسەر فەرز بوونی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ.

لـەکۆتایی ئـەم بـەخۆدا چـوونەوە خێرایـەدا لەگـەڵ شـاعیری خواناس (بێخود)دا دەڵێین:

هـەتـا تـەجـەللی خوا لەعالەما بکا ظهور

بەئاگری گوڵی چەمەن چیا ببێتە کێوی طور

فریشتەو ئادەمی دەڵێن هەتا ئەبەد لەخوارو ژوور

صەڵاتی حەق لەسەر شەهێ کە شەق ئەکا قەمەر لە دوور

سەلامی حەق لەسەر مەهێ کە ئەسپی خۆر لەغاردەکات

## لەدوعای خێر بێبەشمان مەکەن

لەسـەر خواسـتی نووسـەر ئـەم بەرهەمانـەی نوسـەر لـەژێر چاپدایە:

١-فەرهەنگی بانگخوازان.

٢-بەرەو پەروەردەی ئیسلامی.

٣-ڕامان لە قورئان.

# بەرهەمەکانی نووسەر

١-بەهاری دڵان.

٢-لەخزمەت قورئاندا.

٣-بەرچاو ڕوونی.

٤-بەرەو ئیسلام.

٥-ژیانەوە.

٦-فەرهەنگی بانگخوازان.

٧-بەرەو پەروەردەی ئیسلامی.

٨-ڕامان لە قورئان.

٩-ڕازی قورئانی.

بەیانی گەورەیی خولقی کەسێ نایەت لەشەئنی بێ
ئەمقدووری من و تۆیە، ئەئیشی (قس) و (سبحان)ە
لەئادەم تا مەسیحا، ئەنبیا یەك یەك بەقەومی خۆی
خەبەرداوە: لەپاش ئێمە کە دێ ئەو فەخری ئەکوانە
ئەوەندە چاوی پڕ بێ نووری پڕ نوور و منەوەر کرد
کە نەرگس چاوەچاوی نووریە لەو نووری چاوانە
خەبەردانی لەموستەقبەل قسەی چی لێ بکەم تا حەشر
هەمووی بەرطیبقی فەرموودەی ئەوە ئەم واقیعاتانە
بەیانی شەش حەو ئیعجازی لەجوملەی صەد هەزار ئیعجاز
ئەوی دەیکا پەشیمانە، ئەوی نەیکا پەشیمانە
هەتا هەوری بەهاری غازەکاریی گولشەنە ئیشی
هەتا بولبول لەسەر گوڵ نەغمە خوان و نالە سەنجانە
بلێن ئینس و مەلەك پڕ بەم زەمین و ئاسمانانە
(وصلی الله علی ) ئەو بەحری نووری عیلم و عیرفانە
کە دەرکی غەوری ناکا ( غیر علم الله سبحانە)

مەحوی

ژمارەی سپاردن ( ٢٣٤ ) ی ساڵی (١٩٩٩)